جگە لەو هاوچەشنییە نەتەوەییە بێهاوتایەی دانیشتوانی سلێمانی، لەڕووی ئاینیشەوە (٩٩,٦٨)ی دانیشتوانەکەی هاوئایینو هاومەزهەبن[٢٧] و لەوسۆنگەیەشەوە سلێمانی شارێکە تەنیا دوو سەدە کەلای مێژوو دوێنێ دەکات تەمەنیەنی، پێوەندی شارو دێ کۆکو پتەوەو هەر بنەماڵەیەك لە ڕەچەڵەکدا بنەمایەکی لادێی هەیەو سەر بەیەکێك لەناوچە دێهاتنشینەکانە.

لەمڕۆداو لەپێودانگی بنەما جیۆستراتیجییەکانەوە، گواستنەوەی بەشێکی دامودەزگا ئیدارییەکانی دەسەڵاتی کوردان بەچەند وەزارەتێکیشەوە بۆ سلێمانیو دەوروبەری، لەڕووی ئاسایشی نەتەوەییەوە گرنگی گەورەی دەبێت.

## (٤-٣-٤): هەرێمی رزگارکراوی کوردستان- سەرچاوەکانی هێز

لەڕووی جوگرافییەوە هەرێمی رزگارکراوی کوردستان هەموو شارو شارۆچکەکانی سەر بەپشتێنەی دەشتە شاخاوییەکانی کۆنترۆڵ کردووە بەڵام لەپشتێنەی دەشتە گردۆڵکەییەکاندا جگە لەهەردوو شارۆچکەی کفریو کەلار، ئیتر هەموو ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەردایە.

زۆربەی ناوچەکانی هەرێمی رزگارکراو ئامبازی ئەو چیاو قەدپاڵانەن کە بەرزاییەکانیان لەنێوان (١٥٠٠-٣٥٠٠م) دایە هێندێك شیوو نشێوی بەقوڵایی (١٠٠٠م) بەناخی زەمیندا رۆچووەو رێگاوبانو هێندێك لەشارێ گرنگەکانی تێکەڵی چەندین دەربەندو گەلیو ئاوەڕۆی چۆمو رووبارەکان دەبێتو، کەشوهەوای هێندێك ناوچەی تری لەوەرزی بەفرانباردا بۆ چەند هەفتەیەك رێگا بەڕووی هاتوچۆدا دەگرێتو، تەنانەت هێندێك ناوچەی تری لەبەرنەبوون یا خراپی رێگاوبان تائێستا دوورە دەستو چەپەك ماونەتەوە.

چیاکانی کوردستان بەشە ناوەندییەکانی چیاکان زاگرۆسو تۆرۆس پێکدەهێنن. لەباشورەوە گەوەکانی زاگرۆس تا خۆرهەڵاتی کەنداوی عەرەب- فارس دەکشێنو، لەباکورەوە گەوەکانی تۆرۆس نزیك بە باکوری خۆرهەڵاتی کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست دەبنەوە.

ئەگەرچی لەڕووی سۆسیۆ- شارستانییەوە بەشێکی گەورەی هۆی دواکەوتنو پچڕپچڕی کورد بۆ باری تۆبۆگرافی کوردستان دەگەڕێتەوە، بەتایبەتیش کەدرێژترینو بەرزترین چیاکانی کوردستان بەشەکانی ناوەڕاستی کوردستانیان داگیرکردووە، بەڵام لەڕووی عەسکەرییەوە بەدرێژایی مێژوو،

چیاکانی کوردستان قولأیی ستراتیجیو پارێزەری بوونی کوردو هۆکاری زەلیل نەبوونی دانیشتواکەی بوون. خاوەنی کتێبی (کوردو عەجەم) سەبارەت بەجێۆپۆلەتیکی کوردستانو گرنگی ستراتیجی چیاکانی نووسیویە: (هێنانی پایتەختی خەلافەتی عەرەبی- ئیسلامی بۆ بەغداد (...)، بەکردەوە کوردی خستەژێر تینی گوشاری رووبەڕوو و بەردەوامی عەرەبو تەعریبەوە (...)، لافاوی بەخوڕی تەعریب کە لەماوەیەکی کورتدا خواروی ئەرزی میزۆپۆتامیا، رۆژئاواوی روبارەکانی فوراتو دیجلە، هەموو سەرزەمینی شام، سەروی ئەفریقا، تەنانەت گەیشتە ئەندەلوس لەئیسپانیا، کەچی لەبناری زاگرۆسدا، واتە لەسەر سنوری شوێنی ژیانی کورد، نەیتوانی زیاتر تەشەنە بکاتو بتەنێتەوە، بگرە ئیتر لەوێدا راوەستا[٢٨]).

لەسۆنگەی تۆبۆگرافیاو سروشتی خاکی ناوچە شاخاوییەکانەوە کە زۆربەی هەرەزۆری ئەو ناوچانەش دەگرێتەوە کەئێستاکە دەسەلأتی کوردان تیایاندا بەرکەماڵە، ئەم ناوچانە سروشتێکی دیفاعییان هەیە. ناوچە شاخاوییەکان هێزی شەڕکەر ناچاری لوتکەو پەناو پاسارەکانی خۆی دەکات، پشت ئەستور بەم هێزە مادییە، هێزی شەڕکەر بەشێکی زۆر تواناکانی شەڕکردنی خۆی لەسەر بنچینەی هەبوونی هەمیشەیی ئەو هێزە سروشتییە لەکۆتایی نەهاتووە بەرجەستە دەکات. ئیتر هەر ئەم ریتمە ناقولأیەشە وایکردووە کە بیرکردنەوە لەهەر جۆرە پەلهاویشتنو کارێکی فراوانخوازی لەمێژوویەکی دوورەوە لەعەقلی سیاسی کوردا بخەسێنێت.

هەرچەندە (ئەنفال) فکرەی (بەرگریکردنی تاسەر)و (بەرگریکردن لە قولأیی چیاکاندا)ی هەر هیچ نەبێت لەم بەشەی کوردستاندا تەفروتونا کردو، هێزی سوپای داگیرکەر بەرزترین لوتکەی چیاو قایمترین سەنگەرو قولترین شیوو دۆڵی لەهێزە شاخاوییەکان داگیرکرد، بەلأم هێشتا کە ئەو پرەنسیپە عەسکەرییەی کە بەدرێژایی مێژووی شەڕی کورد لەگەڵ داگیرکەرانیدا چیاکانی بەباشترین شوێنی بەرگریکردنو درێژەپێدانی بەرگریکردن داناوە، هەمان پرەنسیپ تا رۆژی ئەمڕۆ درێژەی هەیەو تا ئەو دەمەش کورد لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆو یەکگرتوودا خاوەن سوپایەکی مۆدێرنو نیزامی نەبێت، نە لەتوانایدا دەبێت ئەو پرەنسیپە مایە پوچ بکاتەوەو نەدەشتوانێت ستراتیجێکی عەسکەریی رۆشنو کاریگەری بۆ خۆی دەستەبەربکات.

ئێستا هەرێمی رزگارکراوی کوردستان ئەو وڵاتەیە کە بۆخۆی نە دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێکدەهێنێت و، نەخاکێکی کۆڵۆنیکراوە کاروباری بەدەستەوە نەبێت و، نە لەژێر پارێزگاری هیچ دەوڵەتێکی داگیرکەری چواردەوریدایەو، نەوڵاتێکیشە لەژێر ماندات و (وصایە)دا بێت.

ئەم بەشەی کوردستانی باشور شێوە بەرێوەبردن و دەسەڵاتێکی ناوازەی دنیایە تائێستا هیچ ناوێکی لێ نەنراوە.

ئەگەرچی عەقڵی دەسەڵاتداری کورد لەمرۆدا پێی خۆشە وادەربخات کەخاوەن ستراتیجێکی دیفاعییانەیەو لەرێی پشتیوانی سیاسیو دیپلۆماسی دەرەوەو بەئاواتی گۆرانێکی چۆنایەتی لەبارودۆخی ناوچەکەدا خۆی لەقاڵبی چاوەروانیەکی بەگوماندا مۆڵەق کردووە، کەچی میکانیزمەکانی ستراتیجییە دیفاعییەکە لەبنکەی ئەنچەرلیکەوەو لەتەوژمی تۆقێنەرانەی ئەو فرۆکە تیژرەوانەوە سەرچاوەی گرتووەو بەردەوامی بەبارەکە بەخشیوە کەبریاری بێتاقەت بوونیان لەدەست کوردو بەدڵی کورد ناچێت بەرێوە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی چوارەم:-

١-محمد ازهر سعيد السماك(الدكتور)، الجغرافية السياسية - اس تطبيقات، جامعة الموصل مديرية دارالكتب للطباعة والنشر، ١٩٨٨. ل ٣٥١.

٢-بۆ زۆرتر زانیاری بروانە: هەمان سەرچاوە، ل ٣٥١.

٣-بۆزۆرتر زانیاری بروانە: شاكرخصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، بغداد، مطبعة شفيق، ١٩٧٣.ل ٤٩٦.

٤-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء، المجموعة الأحصائية السنوية لسنة ١٩٧١، ل٢٥٦

٥-محمد ازهر سعيد السماك (الدكتور) واخرون، العراق- دراسته اقليميه، ج٢، جامعه الموصل، مديرية مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥ ل٤٧٤.

٦-هەمان سەرچاوە. ل٤٧٧.

٧-هەمان سەرچاوە. ل٤٧٨.

٨-تەنیا ئەو ڕێگاوبانە نێودەوڵەتییانەمان نوسیوە کەبە کوردستانی باشوردا ڕەت دەبن. بەمەش لەسەرێکەوە عیراق بەکوردستانی باشورو وڵاتانی دەوروبەرەوە دەبەستێتەوەو، لەوسەرەکەی تریشەوە کوردستانی باشور بەعیراق و وڵاتانی دەوروبەرەوە گرێ دەدان.

٩-محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور) واخرون، سەرچاوەیەکی پێشوتر. ل٤٣٢.

١٠-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء، خطة التنمية المكانية لمحافظة السليمانية لعام (٢٠٠٠)، بغداد، ١٩٩١ ل٣١٥.

١١-هەمان سەرچاوەی پێوو. ل٣١٦.

١٢-لەشرۆڤەکردنی تۆڕی ڕێگاوبانەکانی ناوخۆو دەرەوەی کوردستانی باشوردا، سود لەم دوو سەرچاوەیە وەرگیراوە.

-اقليم كردستان العراق، وزارة الأشغال والأسكان، مديرية الأشغال والأسكان- الطرق، اسماء و مواقع الجسور الكائنة في محافظات (دهوك، اربيل، السليمانية)، بيان غير منشور. هەروەها- الجمهورية العراقية، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، بغداد، مطبعة الكلية العسكرية ، ١٩٧٥

١٣-بەمەبەستی زانینی گرنگی بەنداوو عەماراوەکانی کوردستانی باشور لەکەمکردنەوەو نەهێشتنی مەترسی لافاو لەسەر بەغداو ناوچەکانی دەوروبەری، مێژووی گەورەترین (١٠)دە لافاوی نێوان ساڵەکانی ١٩١٧ -١٩٥٤ دەخەینەڕوو پێش دروستکردنی بەنداوو عەماراوەکانی کوردستان کەبەهۆی شکانی بەست (سداد)ە کەی هەردوولای دیجلە لەباکوری شاری بەغدا، بەغدای ڕووبەڕووی نقوم بوون کردۆتەوە.

١٤-لەساڵی ١٩١٩دا ئاوەڕۆی هەردوو ڕوباری دیجلەو فورات زیادیان کردو کونی جیاجیا کەوتە بەستەکەی باکوری بەغداوە، بەوهۆیەوە زیانی گەورە لەمەزراکانی دەوروبەری ڕوبارەکەو هەروەها زیانی ماڵی گەورە بەرکارەساتبارەکان کەوت.

١٥-لەساڵی ١٩٢٣دا ئاوی دیجلە زیادی کردو بەری چەپی بەستەکەی باکوری بەغدا لەدوو لاوە شکاو بڕێکی زۆر ئاو لەپشتی بەستەکەی خۆرهەڵاتی پایتەختەوە کۆبووەو بەغدای ڕووبەڕووی مەترسی نقوم بوون کردەوە.

١٦-لەساڵی ١٩٢٦دا ئاوی دیجلە زیادی کردو ئاوڕێکخەری جۆگەی (الدفاعی) تەقییەوەو ناوچەی نێوان نیوەڕێی ئەعزەمیەو بەغدا نقوم بوو. هەروەها ئاو دزەی بۆ ناو شارکردو زیانی گەورەی بە بەشێکی دانیشتوان گەیاند.

١٧-لەساڵی ١٩٣٧دا ئاوەڕۆی دیجلە زیادیکردو بەری خۆرهەڵاتی بەستەکەی باکوری بەغدا لەچەند لایەکەوە شکاو ئاو تاپشتی شارەکە دزەی کرد.

١٨-لەساڵی ١٩٤٠دا لافاوی دیجلە مەترسییەکەی گەورەی پێکهێنا. لەهەردوو لای بەستەکەی ئەم بەرو ئەوبەری ڕووبارەکەدا شکانی جیاجیا ڕوویان دا. لەهەمان کاتدا بەهۆی لافاوی ڕوباری فورات پرۆژەی ئاودێری (الصقلاويە)و زەوییەکانی (عقرقوف) لەبەری خۆرئاوی شاری بەغدا نقومی ئاو بوون.

١٩-لەساڵی ١٩٤١دا لافاوی دیجلە هەموو ژمارە تۆمارکراوەکانی پێشوی تێپەڕاند، لەبەری چەپی دیجلەوە بەستەکەی باکوری بەغدا لەچەند لاوە شکا. هەمان کات ڕوباری سیروان زیادیکردو ئەمەش وایکرد ئاوی هەردوو

روبار لە پشتی بەشەکەی خۆرهەلاتی بەغدا کۆببێتەوەو ناوچەکانی جادریەو بەشێکی (معسکر الرشید) و زەعفەرانیە لەباشوری بەغدا نقوم بکات.
٢٠-لەساڵی ١٩٤٢دا هەردوو روباری دیجلەو سیروان لەیەک کاتدا بەرێژەیەکی زۆر زیادیان کردو ئاوی روباری سیروان لەپشتی بەستەکەی خۆرهەلاتدا کۆبووەوەو لەگەڵ ئاوی گونجە شکاوەکانی بەری چەپی بەستەکەی دیجلەدا دزەیان کردو بەشەکەی خۆرهەلاتی (معسکر الرشید) نقوم بوو.
٢١-لەساڵی ١٩٤٦دا روباری دیجلە بەشێوەیەک زیادی کرد، ئاستی ئاوو ئاوەرۆکەی ئاستی ساڵانی پێشووی تێپەڕاندو بەمەش چەند قڵیشێک کەوتە بەستەکەی بەری چەپی روبارەکە لەباکوری بەغدا. لەهەمان کاتدا روباری سیروان زیادیکردو ئاوی هەردوو روبار لەپشتی بەستەکەی خۆرهەلاتدا مۆڵیان خوارد. (معسکر الرشید)و زەعفەرانیەو (الرستمیە) ژێر ئاوکەوتن‌و وای لێهات بەغدا بەدەریایەک لەئاو دەورەدرابوو.. بەشێکی زۆری شەقام‌و بەشێکی خانووبەرەکانی خۆرهەلاتی بەغدای نقوم کرد..
٢٢-لەساڵی ١٩٥٠دا هەردوو روباری دیجلەو سیروان لەیەک کاتدا زیادیان کردو چەند درزێکی کەوتە بەستەکەی خۆرهەلاتی باکورو باشوری بەغداو، ئاو لەپشتی بەستەکەی خۆرهەلاتدا مۆڵی خواردو بەغدا رووبەڕووی مەترسی ژێرئاوکەوتن بووەوە. لێپرسراوان بەناچاری ناوچەکانی (بغداد الجدیدە)و (معسکر الرشید)و (الجادریە)و زەعفەرانیەو ناوچە کەنارییەکانی روباری سیروانیان ژێر ئاوخست، بەغدا بەرێکەوت لەنقوم بوون رزگاری بوو.
٢٣-لە ١٩٥٦/٣/٢٩ پێوەرەکانی سەرچۆمەکانی دیجلە هەموو رێکۆردەکانی پێش خۆیان تێپەڕاند. بۆیە یەکسەر پەنجەرەکانی ئاورێکخەری سەرسارکرانەوەو ئاوەکە لەوێدا عەمارکرا. دەریاچەی (الثرثار)ی نزیک بێجی لە توانایدایە نیوەی ئاوی لافاوی دیجلە بەرەوخۆی ببات. قەوارەی عەماراوەکە (٨٨,٩) ملیار مەترسێجایەو ئێستا توانای عەمارکردنی (٥٨,٨) ملیار مەترسێجا ئاوی هەیە.
بەم شێوەیە عەماراوەکانی موسڵ‌و سەرسارو دوکان‌و دەربەندیخان‌و حەمرین‌و دبس پێکەوە، بۆ هەزار ساڵی داهاتوو مەترسی لافاوی دیجلەیان بۆ سەر ناوچەکانی دەرروبەری روبارەکەو شاری بەغدا نەهێشتووە.
(بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە:
-محمود شوقي الحمداني، لمحات من تطور الري في العراق، مطبعة السعدون، بغداد، ١٩٨٤ ل٩٦-٠٠
٢٤-حسام الدين النقشبندي (الدكتور)، "المدن القديمة النمدرسة في محافظة السليمانية و تعيين مواقعها" مجلة كاروان، (العدد ٣٤، السنة الثالثة، تموز ١٩٨٥" ل١٥٠
٢٥-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي الأحصاء، خطة التنمية المكانية لمحافظة السليمانية لعام٢٠٠٠، بغداد، ١٩٩١، ل١١.
٢٦-ئەم زنجیرە چیایە بەو شوێنانەی کەپێیدا تێپەڕدەبێت، ناوی جیاجیا هەڵدەگرێت، بۆ نمونە چیای قەرەداغیشی پێ دەوترێت.
٢٧-شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، سەرچاوەیەکی پێشووتر. ل٢٥،٢٦.
٢٨-ئەم روپێوەو روپێوی هێندێک لەپارێزگاکانی تری کوردستانی باشور لەدوای ساڵی (١٩٨٥)ەوە گۆڕانکارییان بەسەرداهاتووە، بۆ نمونە روپێوی پارێزگای سلێمانی بووەتە (١٧٠٢٣کچگ)، هەولێر (١٥٠٧٤کچگ)و دهۆک

(٦٥٥٢کچگ). لەپاش ساڵی ١٩٨٥، لە گەرمەی جەنگی عیراق- کوردستان و عیراق- ئێرانداو لەدیدی ئاسایشی ستراتیجی عیراقەوە، چەندین قەزاو ناحیەو ناوچەی جیاجیای ئیداری کوردستانی باشور گۆڕانیان بەسەرداهات و هێندێکیان لەنەخشەدا سڕانەوە. بۆیە ئەگەرچی ئێمە سەرژمێرییەکانی ساڵی (١٩٩٠)مان لادەست دەکەوت، بەڵام لەدابەشبوونی ئیداری- سیاسی کوردستانی باشوردا، ئەوەکەی ساڵی (١٩٨٥)مان کردە بنەما. بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە:

-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط الجهاز المركزي الأحصاء، الوحدات الأدارية ومساحتها، بغداد، ١٩٨٥ هەروەها- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء الوحدات الأدارية و مساحتها، بغدا، ١٩٩٠.

٢٩-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط الجهاز المركزي للأحصاء، الوحدات الأدارية ومساحتها، بغداد، ١٩٨٥

٣٠-جمال بابان (الدكتور)، "السليمانيه في نواحي المختلفه" گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

٣١-فؤاد حمة خورشيد، (مدينة السليمانية- دراسة في جغرافيتها التأريخية) مجلة كاروان، (العدد ٥٤، السنة الخامسة، نيسان ١٩٨٧).

٣٢-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: خەلیل ئیسماعیل (دکتۆر)، "دابەشبوونی جوگرافیو نەتەوەیی کورد لەعیراقدا" گۆڤاری سیاسەتی دەولی، (ژمارە ٢، ساڵی دووەم، تەمموزی ١٩٩٣).

٣٣-الجمهورية العراقية وزارة التخطيط، الجهاز المركزي الأحصاء تقديرات السكان العراقيين حسب المحافظة واالجنس لسنة ١٩٩٠، بغداد ل٢٦.

٣٤-الجمهورية العراق، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء خطة التنمية المكانية... سەرچاوەیەکی پێشوتر. ل٤٩

٣٥-خەلیل ئیسماعیل (دکتۆر) هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٢٦

٣٦-شاكر خصباك (الدكتور)، الأكراد، مطبعة شفيق، ١٩٧٣، ل٧٩.

٣٧-ئەوە لەکاتێکدا هاوچەشنی ئایینیو مەزهەبی لەپارێزگای هەولێر (٩٣-٩٧)و لەدهۆك (٣٧-٨٩)و لەکەرکوك (٣١-٩٧)و لە موسڵ (٦٩-٨٦)ە. بڕوانە:

-الجمهورية العراقية وزارة الداخيلة، مديرية الأمن العامة مركز الأعداد والتطوير الثقافي، التوزيع الديني للسكان العراقيين، بغداد مطبعة مديرية الأمن العامة، سنة (بلا)

٣٨-ساڵح محەمەد ئەمین، کوردو عەجەم هەولێر، ١٩٩٢، ل ١٤، ١٥

# کۆبەندو ئەنجامگیری

لەبەرئەوەی کورد خاوەنی دەوڵەت نییە، بۆیە هەر لێکۆڵینەوەیەکی ستراتیجیو لەنێو ئەوانەشدا لێکۆڵینەوە لە جوگرافیای عەسکەریی وڵاتەکە، هێندەی کارێکی تیۆری دەبێت، لەڕووی پراکتیکەوە دەست کورتو بێدەرەتان دەبێت. بەڵام هەرکارێکی تیۆریش دواجار کۆمەڵێك ئەنجامی لێدەستگیر دەبێت، دەتوانین ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەم پێنج ئەڵقەیەدا کۆبەند بکەین:

**یەکەم:** لەڕووی جوگرافیای سروشتییەوە، کوردستانی باشور بەو روبەرەی کە داگیری دەکات (زۆرتر لە ٨٥٠٠٠ کچگ)، بە بەراورد لەگەڵ عێراقدا- بێکوردستانی باشور (٣٥٠,٠٥٢ کچگ)-، کەسایەتیەکی جوگرافیی سەربەخۆو جیاواز لەعێراق پێکدەهێنێت.

لەکاتێکدا بیابانو رەشەخاك رووەکانی خاکی عێراق پێکدەهێنن، کەچی بەشێوەیەکی گشتی ناوچە شاخاویو نیمچە شاخاوییەکان رووی خاکی کوردستانی باشور پێکدەهێنن.

جگە لەڕووەکانی خاك، لەڕووی کەشوهەواشەوە جیاوازییەکی ئاشکرا لەنێوان هەردوو وڵاتدا هەیە... بەوپێیەی کوردستانی باشور جیا لە عێراق، دەکەوێتە ژێر کاریگەری راستەوخۆی کەشوهەوای دەریای سپی ناوەڕاستەوە، بۆیە بڕی باران بارینی ساڵانە جیاوازییەکی گەورەی لەنێوان هەردوولادا هەیە. لەکاتێکدا بڕی باران بارینی ساڵانە لەوپەڕی باشوری عێراقدا تەنیا (٥سم) دەبێت، کەچی بڕی باران بارینی ساڵانە لەهەرێمی شاخاوی کوردستانی باشوردا دەگاتە (١٠٠سم).

لەهەمان سۆنگەی کەشوهەواو جۆری خاکەوە سەرچاوەکانی ئاویش، بڕو جۆری ئەو سەرچاوانە، جیاوازی گەورەیان لەنێوان هەردوولادا هەیە. بڕی (٦٥,٧٧٪)ی ئاوی روباری دیجلە، کەشان بەشانی روباری فورات تاکە سەرچاوەی ئاوی عێراقن، لەکوردستانەوە هەڵدەقوڵێنو دەڕژێنە رووباری

ناوبراوەوە. پاشانیش هەر لەڕێی بەنداوو عەماراوەکانی کوردستانی باشورەوەیە، عێراق پێداویستی خۆی بۆ ئاودێری دابین دەکات.

هەر لەم پێوەندیەوە، تایبەتمەندێتیە جوگرافییەکانی هەردوولا، لەڕووی ستراتیجی عەسکەرییەوە کارایی جیاوازی بۆ هەردوولا خوڵقاندووە.

دووەم: لەڕووی جوگرافیای عەسکەرییەوە، کوردستانی باشور گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەریی عێراق- تورکیاو بەشێکی گەورەی عێراق- ئێرانو بەشێکی عێراق- سوریایە. گرنگترین تەوەرە ستراتیجییەکانی نێوان عێراقو ئەو وڵاتانە بەکوردستانی باشوردا رەت دەبنو بەشی گەورەی ئامانجە ستراتیجییەکانی ئەو وڵاتانە دەکەونە کوردستانی باشورەوە. هەر بەوپێیە کوردستانی باشور گرنگترین گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەریی عێراقو هەریەکە لەئێرانو تورکیاو سوریاو، ئەو وڵاتانە لەگەڵ عێراقدا پێکدەهێنێت.

سێیەم: سنوری کوردستان بەعێراقەوە، لەشێوەی هێڵێکی نارێکوپێکدایە، ئەو سنورە لەڕووی عەسکەرییەوە بۆ هەردوولا چەند ناوچەیەکی قۆقزو چەند ناوچەیەکی تری رووچاڵی خوڵقاندووە.

هێڵی سنوری کە لەشارۆچکەکانی بەدرەو جەصان لەوپەڕی باشوری خۆرهەڵاتەوە دەکشێن، بەرەو باکوری خۆرئاوا لەنزیك شارۆچکەی شنگار کۆتایی دێت. بەوپێیە ئەو گۆڕەپانی جموجۆڵە عەسکەرییەی دەکەوێتە نێوان کوردستانی باشورو عێراقەوە، گۆڕەپانێکە بەدرێژایی سنوری نێوان هەردوولا دەکشێت.

لەکاتێکدا گۆڕەپانی جموجۆڵ بەنسبەت عێراقەوە شارەکانی بێجی، تکریت، سامەڕا، عوزێم، خالص، بەغدا، بەعقوبە، کوت، لەخۆدەگرێت، بەنسبەت کوردستانەوە گۆڕەپانی جموجۆڵ هەریەك لەشارو شارۆچکەکانی بەدرە، مەندەلی، خانەقین، کەلار، کفری، دوزخورماتو، کەرکوك، هەولێر، موسڵ، دەگرێتە خۆی.

سێ تەوەرەی سەرەکی دەکەونە گۆڕەپانی کوردستان لەگەڵ عێراقدا، ئەوانیش تەوەرەکانی (خانەقین- بەغدا)، (کەرکوك- بەغدا)و (موسڵ- بەغدا)ن. گرنگترین ئامانجە ستراتیجییەکانی عێراق، موسڵ کەرکوكو هەولێرو خانەقینە، بەڵام گرنگترین ئامانجی ستراتیجی کوردستان بەغداو تکریتو بەعقوبەو کوت دەبێت. ئەمە لەبارێکدا گەر موسڵ بەشێك بێت لە کوردستانی باشور، ئەگەرنا،

ئـەوا موسـڵ کـە لەسـێ لاوە بەکوردسـتان دەورە دەدرێـت یەکـەمین ئامـانجی ستراتیجی کوردستان دەبێت.

عـێراق لەداڕشـتنی تـەوەرە سـتراتیجییەکانی بـەرگریکردنی خـۆی دژ بەکوردستان، پاراستنی هەردوو شاری گەورەی بەغداو موسڵ دەکاتە بنەما. لەکاتێکدا عێراق هەرسێ پارێزگاکانی واسـتو دیالـەو سەلاحەدین دەخاتـە نەخشەی پاراستنی پایتەختەوە، بەڵام هیچ ناوچەیـەکی گرنگـی بەدەسـتەوە نییە بیخاتە نەخشەی پاراستنی شاری موسڵەوە، بۆیـە موسڵ گەر بەدەست کوردیشـەوە نـەبێت، لەلایـەن قـەوارەی داهـاتوی کوردسـتانەوە ئامـانجێکی هەمیشە هەڕەشە لێکراو دەبێت.

**چـوارەم:** کوردسـتانی باشـور وڵاتێکـی کۆڵۆنییـە... کوردسـتانی باشـور بـەزەبری چـەكو هـێزی سـوپاو دوور لەخواسـتی دانیشـتوانەکەی لکێـنراوە بەعێراقەوە. عـێراقی ئێسـتا کـە ئیمپریـالیزمی بـەریتانی وەکـو ئەنجامـەکانی جـەنگی جیـهانی یەکـەمو پێبـەپێی بەرژەوەندییـە ئـابوریو سـتراتیجییەکانی خۆی کردیـە دەوڵـەت، پێش دروستبوونیو بەدرێژایی مێژوو بەم قەوارەیـەی ئێستایەوە هەرگیز بوونی نەبووە.

کوردستانی باشور لەژێر سایەی حکومەتە عەرەبییە یەك لەدوای یەکەکانی عـێراقدا، وەکـو وڵاتێکـی زۆرلێکـراو مامەڵـەی لەگـەڵدا کـراوە. لەسـەردەمی فەرمانڕەوایـەتی بەعسـدا، لـەڕووەکانی عەسـکەریو سیاسـیو دیمۆگرافـیو ئابورییـەوە دەوڵـەتی عـێراق وەکـو سیسـتمێکی کۆلۆنیـالی رەفتـاری لەگـەڵ کوردستانی باشوردا کردووە. عێراق لەکوردستاندا لەڕێی شێوازەکانی کـۆچ پێکـردنو سـوتماککردنو قڕکـردنو پاشـانیش مرومۆڵگـە دروسـتکردنو تـەعریبکردنی وڵاتەکـە، بەسیاسـەتی کۆلۆنیـالیزمی نیشـتەجێکردن کـاری کردووەو پێکهاتەی دانیشتوانەکەی تێکوپێك داوە.

لەداڕشـتنی تـەوەرە سـتراتیجییەکاندا دژ بەمەترسـییەکانی نـاوەوە کـورد، دەوڵەتی عێراق لەناوخۆدا هەموو ناوچە پەترۆڵییەکانی کوردستانو ئەو ناوچە کوردنشینانەی کە لەمەڵبەندە عەرەب نیشینەکانەوە نزیکن، لەدانیشتوانەکەی

چۆڵ کردو وەکو زۆنێکی ئاسایش هەموو ئەو ناوچانەی کردە لەمپەری نێوان عێراق و ئەو ناوچەیەی کەبەناوچەی ئۆتۆنۆمی ناسرابوو.

**پێنجەم:** لەئەنجامی راپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١ز)دا، بەشێکی خاکی کوردستانی باشور کەڕووپێوەکەی بە دەوروبەری (٤٠٠٠٠ کچگ) دادەنرێت، رزگارکرا.

ئەگەرچی هەرێمی رزگارکراوی کوردستان گرنگترین و سەرەکیترین مەڵبەندەکانی دانیشتوانی کوردستانی باشوریان تێدەکەوێت، بەڵام گرنگترین و سەرەکیترین مەڵبەندە ئابوری و ستراتیجیەکان هێشتاکە لەدەرەوەی ئەو هەرێمەن.

هەرێمی رزگارکراوی کوردستان کەنیوە کەمتری خاکی کوردستانی باشور دەگرێتەوە، بەرامبەر بەعێراق وڵاتێکی قەوارە بچوک و کەم دەرفەتە.

لەڕوانگەی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە گرنگترین تەوەرەکانی جموجۆڵ و گرێکانی هاتوچۆ کە خۆیان لەشارەکانی موسڵ و کەرکوکدا دەبیننەوە، لەبەردەست عێراقدان. هێڵی سنوری کەبەشێوەیەکی ترسناک لەپایتەختی هەرێمی رزگارکراوو ناوچەکانی بادینان نزیك دەبێتەوە، لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا ئەگەری بەرگری لێکردن و بەدەستەوەنەدانی ئەو ناوچانە کزو لاواز دەکات. هەڵکەوتەی بەشی گەورەی هەرێمی رزگارکراوی کوردستانیش لەناوچە شاخاوییەکانی کوردستانی باشوردا، پشت بەستن بەپرەنسیپی بەرگریکردن و سوود وەرگرتن لەقوڵایی ستراتیجی چیاکان بەرجەستە دەکاتەوە.

بێ پشتیوانی عەسکەرییانەی خۆرئاوا، مانەوەی هەرێمی رزگارکراوی کوردستان بەم قەوارە جیۆپۆلەتیکییەی ئێستایەوە کارێکی مەحاڵە. کورد بەم قەوارە چکۆلەیەی ئێستای هەرێمی رزگاکراوەوە، گەر سوپاش پێکەوەبنێت، توانای خۆگیڤ کردنەوەی لەعێراق و هیچ دراوسێیەکی تری نابێت.

بێ رزگاکردنی بەشە گرنگ و ستراتیجییەکەی کوردستانی باشور، موسڵ و ناوچە کوردستانییەکانی سەر بەپارێزگای نەینەوا، کەرکوك تاچیای حەمرین،

خانەقین و ناوچەکانی خوارووی، هەرێمی رزگارکراوی کوردستان توانای ئامادەبوون و بەردەوامبوونی تاسەری نابێت.

لەراپەرینی (١٩٩١ن)دا، دەکرا ئەگەر خانەقینیش لەدەست بدرایە، کەرکوك لەدەست نەدرایە. لەڕاپەڕیندا دەبواو دەکرا پەلاماری موسڵ بدرایە، ئەگەر رزگاریش نەکرایە لانی کەم مێژووی کوردستانی بوونی لەیادەوەریدا پاراوبکرایە. دوای راپەڕین دەبواو دەکرا جارێکی تر لەهەلمەتەکانی جەماوەری چەکداردا کەرکوك ئازادبکرایە، ستراتیجی ترین شاری کوردستان بکەوتایەتەوە دەست خاوەنە کوردەکەی، ئەوانە هیچی نەکران.

لەبەختی کورد، عێراق ئێستاو بۆ ئاییندە گێچەڵی لێبەدوور نابێت، عێراق بەعس بەحاکمی بمێنێتەوە یان هەر رژێمێکی تر، ناتوانێت بەم قەوارەیەی ئێستایەوە ئارامی و ئاسودەی سەقامگیر بکات. عێراق تاهەوڵی بە یەککگرتوویی مانەوەی بدرێت، بێ پشێوی و ئاژاوەو شەڕی خوێناوی بەڕێوە ناچێت.

تائەو دەمەی کورد سوپای مۆدێرن و نیزامی نەبێت، ناتوانێت ستراتیجێکی عەسکەریی رۆشن و کاریگەر بۆ خۆی دەستەبەر بکات.

لەوسۆنگەیەی کە کاروبارە عەسکەری و سیاسییەکان دوو ئامرازی پێوەندارو تێهەڵکێشی ستراتیجی نەتەوەیی و هەردووکیشیان لەشێوەی پێوەندییەکی چڕوپڕدا یەکانگیری یەکدین و جیاکردنەوەیان کارێکی مەحاڵە، بۆیە ناکرێت لە دەرەوەی ستراتیجێکی نەتەوەییدا، نە سوپایەکی مۆدێرن و نیزامی رزگاری بەخش و نەستراتیجێکی عەسکەریی پایە قایم و نە دیبلۆماسیەتێکی سەرکەوتوو بەدەست بهێنرێت.

ئاشکرایە بێ دەسەڵاتێکی نیشتمانی شۆڕشگێڕ، نەستراتیجێکی نەتەوەیی شۆڕشگێڕ دەستەبەر دەکرێت و نەبەئاکامیش دەگات.

## سەرچاوەكان:


### بەزمانی عەرەبی

١-ابراهيم شريف (الدكتور)، الموقع الجغرافي للعراق، الجزء الأول الجزء الثاني، بغداد، مطبعة شفيق، سنة (بلا).

٢-الأتحاد الوطني الكردستاني، أغد ديموقراطي أم حرمان شعب حتى من حق الحلم؟، سنة (بلا).

٣-اقليم كردستان العراق، وزارة الأشغال والأسكان، مديرية الأشغال والأسكان- الطرق، اسماء ومواقع الجسور الكائنة في محافظات (دهوك، اربيل، السليمانية)، بيان غير منشور.

٤-ب.م. دانتسيغ، الرحالة الروس في الشرق الأوسط، ترجمة وتعليق الدكتور معروف خەزنەدار، بغداد، ١٩١٨

٥-باسل نيكتين، الأكراد، بيروت، دار الروائع، ١٩٦٧

٦-تاڤرينه، العراق في القرن السابع عشر كما راه الرحالة الفرنسي تاڤرنيه، نقلة الى العربية وعلق عليه و وضع ملاحقه: بشير فرنسيس و كوركيس عواد بغداد، مطبعة المعارف، ١٩٤٤

٧-ت، و، فريمان، الجغرافية في مائة عام، ترجمة الدكتور عبدالعزيز طريح شريف، بغداد مطبعة افاق عربية.

٨-جاسم محمد الخلف (الدكتور)، محاظرات في جغرافية العراق الطبيعية و الأقتصادية والبشرية، مطبعة لجنة البيان العربي، ١٩٦١

٩-جمال بابان (الدكتور)، (السليمانية في نواحيها المختلفة) گۆڤاری كۆڕی زانياری كورد، بەغدا.

١٠-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي الأحصاء تقديرات السكان العراقيين حسب المحافظة والجنس لسنة ١٩٩٠، بغداد، ١٩٩١

١١-الجمهورية العراقية وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء خطة التنمية المكانية لمحافظة السليمانية لعام (٢٠٠٠)، بغداد ١٩٩١

١٢-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء المجموعة الأحصائية السنوية لسنة ١٩٩٠، بغداد، ١٩٩١

١٣-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي الأحصاء الوحدات الأدارية ومساحتها، بغداد، ١٩٨٥

١٤-الجمهورية العراقية وزارة التخطيط الجهاز المركزي الأحصاء الوحدات الأدارية و مساحتها، بغداد، ١٩٩٠

١٥الجمهورية العراقية وزارة الداخلية، مديرية الأمن العامة، مركز الأعداد والتطوير الثقافي، التوزيع الديني للسكان العراقيين، بغداد، مطبعة مديرية الأمن العامة، سنة (بلا).

١٦-الجمهورية العراقية، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، دائرة الشؤون الأدارية، بغداد، مطبعة الكلية العسكرية، ١٩٨٤

١٧الجمهورية العراقية، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، بغداد مطبعة الكلية العسكرية، ١٩٧٥

١٨-جي، ا، درايڤر، "انتشار الكرد في العصور القديمة" ترجمة فؤاد حەمە خورشيد، مجلة شمس كردستان (العدد ٥٩، ايار وحزيران ١٩٨٠).

١٩-حسام الدين النقشبندي (الدكتور)، "المدن القديمة المندرسة في محافظة السليمانية وتعيين مواقعها" مجلة كاروان، (العدد ٣٤ السنة الثانية، تموز ١٩٨٥).

٢٠-دبليو، ار، هي، سنتان في كردستان، ترجمة فؤاد جميل، الجزء الأول بغداد، ١٩٧٣

٢١-روجر اوين و بوب سوتكلف، دراسات نظرية في الأمبريالية، ترجمة الدكتور وميض جمال عمر نظمي والدكتور كاظم هاشم نعمة، جامعة الموصل مطبعة مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، ١٩٨٠

٢٢-زرار محمد شواني، "الكرد في العصر العباسي حتى مجيء البويهيين" (رسالة ماجستر غير منشورة، جامعة صلاح الدين، كلية الآداب، ١٩٩٤).

٢٣-س. ب. فاوستر، جغرافية المحدود، تعريب محمد سيد نصر، مصر مطبعة الأعتماد، سنة (بلا).

٢٤-س. پيلتير لويس و جي أيزل پيرس، الجغرافية العسكرية، ترجمة الدكتور عبدالرزاق عباس حسين، بغداد دار الحرية للطباعة، ١٩٧٥

٢٥-س. جي. أومونذز، كردو ترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله بغداد مطبعة التايمس، ١٩٧١

٢٦سليمان الدركزلي (العقيد الركن)، جغرافية العراق العسكرية بغداد، مطبعة البرهان، ١٩٥٦
٢٧سميرة الشماع (الدكتورة).
٢٨-شاكر خصباك (الدكتور)، الأكراد، بغداد مطبعة شفيق، ١٩٧٢
٢٩شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، بغداد، مطبعة شفيق، ١٩٧٣
٣٠-صباح محمود الراوي (الدكتور) "المناخ الزراغي في شمال العراق" مجلة كاروان.
٣١-ضرغام عبدالله الدباغ (الدكتور)، قضايا الأمن القومي والقرار السياسي، بغداد مطبعة الأنتصار، ١٩٨٦
٣٢-طه باقر (الدكتور)، مقدمة في تأريخ الحضارات القومية، الجزء الأول، بغداد، مطبعة دارالشؤون الثقافية، ١٩٨٦
٣٣-عباس فاضل السعدي (الدكتور)، منطقة الزاب الصغير في العراق، بغداد، مطبعة أسعد، ١٩٧٦
٣٤-عبدالعزي سليمان نوار، تأريخ العراق الحديث، القاهرة، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والنشر، ١٩٦٨
٣٥-عبدالعزيز طريح شريف (الدكتور)، الأسس والمشكلات في الجغرافية السياسية، الجزء الأول، أسكندرية، ١٩٦٣
٣٦-عبدالمنعم عبدالوهاب (الدكتور)، "الجغرافية العسكرية والمفهوم الجيوبوليتكى"، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، (العدد العشرون، تموز ١٩٨٧).
٣٧-علي حسين الشلش، مناخ العراق، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٨٨
٣٨-فاضل حسين (الدكتور)، مشكلة الموصل، بغداد، مطبعة الرابطة، ١٩٥٥
٣٩-فؤاد حەمە خورشيد، "مدينة السليمانية- دارسة في جغرافيتها التأريخية"، مجلة كاروان، (العدد ٥٤، السنة الخامسة، نيسان ١٩٨٧).
٤٠-سل ويبرسى، الجيوبوليتكا، ترجمة يوسف مجلي و لويس اسكندر، دارالكرنك، القاهرة.
٤١-كمال مظهر أحمد (الدكتور)، بعضى قضايا الشرق الأوسط، بغداد.

٤٢-كمال مظهر أحمد (الدكتور)، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٧٨
٤٣-مجموعة مؤلفين، العراق في التأريخ، بغداد دار الحرية للطباعة، ١٩٨٣
٤٤-محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور)، الجغرافية السياسية- أسس وتطبيقات، جامعة الموصل، مديرية دارالكتب للطباعة والنشر، ١٩٨٨
٤٥-محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور) واخرون، العراق- دراسة أقليمية، جامعة الموصل، مديرية مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥
٤٦-محمد حسين شلاش (المقدم الركن)، الجغرافية العسكرية، بغداد، مطبعة الأرشاد، ١٩٦٩
٤٧-منذر الموصلي، عرب واكراد، دمشق، دار العلم، ١٩٩١
٤٨-منير شفيق، علم الحرب، بيروت، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ١٩٧٢
٤٩-ميريلا غاليتين، "التراث الكردي في مؤلفات الأيطاليين" تعريب و تعليق وايضاحات: الدكتور يوسف حبي، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی کورد (بەرگی هەشتەم)، ١٩٨١
٥٠-هوبير ديشان، نهاية الأستعمار، ترجمة زهير السعداوي، بيروت، مطبعة قلفاط، ١٩٥٣
٥١-الوقائع العراقية، العدد ٣١٥٨، بغداد، ١٩٨٧/٧/١٣
٥٢-وليم ايغلتن الأبن، جمهورية مهاباد ١٩٤٦ الكردية، ترجمة جرجيس فتح الله، بيروت در الطليعة، ١٩٧٢

## بەزمانی کوردی

١-جاسم تۆفیق (دکتۆر)، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە٣
٢-چیا، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی رۆشنبیری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، ١٩٨٧
٣-خەلیل ئیسماعیل (دکتۆر)، "دابەشبوونی جوگرافیی و نەتەوەیی کورد لەعێراقدا" گۆڤاری سیاسەتی دەولی (ژمارە ٢، سالی دووەم تەمموزی ١٩٩٣).

٤-خەلیل ئیسماعیل (دکتۆر)، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە ١١
٥-رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٧، هەولێر ١٩٩٣/٨/٩
٦-سالح محەمەد ئەمین، کوردو عەجەم، هەولێر، ١٩٩٢
٧-عبدالرحمن قاسملو (دکتۆر)، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عبدالله حسین زادە، لەبلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٣
٨-عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، چارەنووسێکی نادیار- چەند دیمەنێك لەئەنفالەکانەوە، بلاوکراوەی کۆمیتەی بەرگری لەمافی قوربانیانی ئەنفالەکان، ١٩٩٣
٩-فەتاحی قازی، کورد لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی حەمە کەریم عارف، دەستخەت.
١٠-کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغداد، چاپخانەی ئەدیبی بەغدادی، ١٩٨٥
١١-م. س. لازارێڤ، کێشەی کورد، وەرگێڕانی (دکتۆر کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩
١٢-محەمەد ئەمین زکی، کوردو کوردستان، جلد ١، بەغدا چاپخانەی دارالسلام، ١٩٣١

**بەزمانی فارسی**

-لسترنج، جغرافیای تأریخي سرزمینهای خلافت شرقي، ترجمة محمود عرفان، چاپ سوم، شرکت انتشارات علمي وفرهنگی، ١٣٦٧

**ئەتڵەس و نەخشەکان**

١-أطلس العراق
٢-الأطلس المتوسط، جامعة الموصل، ١٩٨٨
٣-أطلس کامل گیتاشناسی، چاپ سیزدهم، تهران، ١٣٧١
٤-Der Wellatlas, Druek: Neef und stumme, Wittengen, Germany.
٥-Knaurs Grosse Wellatlas, Dromer Knaur.

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | رووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| دهۆک[٢] | دهۆک | مەڵبەندی قەزا | ١٠٧ |
| | | دۆسکی | ٤٥٤ |
| | | زاوێتە | ٤٣٠ |
| | | | ٩١٨ |
| | ئامێدی | مەڵبەندی قەزا | ٩٣ |
| | | سەرسەنگ | ٩١٩ |
| | | نێورەڤریکان | [illegible]٧ |
| | | بەرواری بالا | ٦٨٨ |
| | | | ٢٧٠٧ |
| | زاخۆ | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | سندی | ٥٣١ |
| | | گلی | ٢٠٨ |
| | | رزگاری | ٢٩٥ |
| | | | ١٠٣٤ |
| | سومێل | مەڵبەندی قەزا | ٣٠٦ |
| | | سلیڤانی | ٨١١ |
| | | فایدە | ٢٨١ |
| | | | ١٣٩٨ |

| | سەرجەم پارێزگاکە | ٦١٢٠ |
|---|---|---|

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | رووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| هەولێر (ئەربیل) | هەولێر | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | مەڵبەندی ناحیە | ٩٢٥ |
| | | قوشتەپە | ١٢٦٠ |
| | | خەبات | ٥٢١ |
| | | | ٢٧٠٦ |
| | مەخمور | مەڵبەندی قەزا | ٤٧٤ |
| | | گوێر | ٥٨٦ |
| | | کەندیناوا | ٧٤٠ |
| | | قەراج | ٩٨٣ |
| | | | ٢٧٨٣ |
| | کۆیە | مەڵبەندی قەزا | ٥٥٨ |
| | | تەقتەق | ٧٣١ |
| | | شۆڕش | ٧٧٥ |
| | | | ٢٠٦٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | ڕەواندز | مەڵبەندی قەزا | ٤٨٥ |
| | | برادۆست | ١٦١٦ |
| | | دیانە | ٣٢٣ |
| | | خەلیفان | ٤٢٨ |
| | | | ٢٨٥٢ |
| | زێبار | مێرگەسور | ١٣٥٣ |
| | | مزوری بالا | (٠٠٠) |
| | | بارزان | (٠٠٠) |
| | | | ١٣٥٣ |
| | شەقڵاوە | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | خۆشناو | ٤٠٤ |
| | | حەریر | ٦٤١ |
| | | پیرمـــــــــــام، سەربەن،سەلاحەدین | ٧٨٩ |
| | | | ١٨٣٤ |
| | چۆمان | مەڵبەندی قەزا | ٦١٨ |
| | | حاجی ئۆمەران | ٢٦١ |
| | | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | ٨٧٩ |
| | | سەرجەم پارێزگاکە | ١٤٤٧١ |

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | رووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | سلێمانی | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | سەرچنار | ٧٠٥ |
| | | تانجەرۆ | ٤٧٦ |
| | | بازیان | ٣٦٨ |
| | | قەرەداغ | ٧٢٧ |
| | | | ٢٢٧٧ |
| | هەڵەبجە | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | سیروان | ٧٨٣ |
| | | خورماڵ | ٢٠٥ |
| | | بیارە | ١٧٤ |
| | | شارەزور | ٣٦١ |
| | | | ١٥٢٣ |
| | پێنجوێن | مەڵبەندی قەزا | ٣٦١ |
| | | ناڵپارێز | ٦٦١ |
| | | | ١٠٢٢ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | شارباژێڕ | مەڵبەندی قەزا | ٦٣١ |
| | | کەناروێ | ٤١٣ |
| | | کارێزە | ٥٨٨ |
| | | سرۆچك | ٥٤١ |
| | | | ٢١٧٣ |
| | پشدەر | مەڵبەندی قەزا | ٣١٣ |
| | | ناودەشت | ٧٨٦ |
| | | هێرۆ | ٢٠٣ |
| | | | ١٣٠٢ |
| | رانیە | مەڵبەندی قەزا | ٦٠٣ |
| | | بێتواتە | ٢٨١ |
| | | | ٨٨٤ |
| | دوکان | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | سورداش | ٦٤٦ |
| | | چناران | ٣٥٥ |
| | | مەرگە | ٦٠٣ |
| | | | ١٦٠٤ |
| | دەربەندیخا<br>ن | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | زەڕایەن | ٤٨١ |
| | | | ٤٨١ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | چەمچەماڵ | مەڵبەندی قەزا | ٨٠٤ |
| | | ئاغجەلەر | ٧٣٤ |
| | | سەنگاو | ٨٤١ |
| | | | ٢٣٧٩ |
| | کەلار | مەڵبەندی قەزا | ٣٣٢ |
| | | پێباز | ٩٩٢ |
| | | تیلەکۆ | ٧٨٧ |
| | | | ٢١١١ |
| | | سەرجەم پارێزگاکە | ١٥٧٥٦ |

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | رووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| کەرکوک | کەرکوک | مەڵبەندی قەزا | ٤٠٦ |
| (تەئمیم) | | قەرەحەسەن، لەیلان | ٧٢٢ |
| | | شوان | ٨١٩ |
| | | تازە خورماتو | ١١٥٠ |
| | | بایچی | ٥١٤ |
| | | داقوق، تاوغ | ١١٥٧ |
| | | قەرەهەنجیر (ئەڵرەبیع) | ٦٦١ |
| | | | ٥٤٢٩ |

| | حەویجە | مەڵبەندی قەزا | ٥٩٦ |
|---|---|---|---|
| | | عەباسی | ٦٣٤ |
| | | ریاز | ١٣١١ |
| | | شەك، زاب | ٧٣٢ |
| | | | ٣٢٧٣ |
| | دوبز (دبس) | مەڵبەندی قەزا | ٥٤٧ |
| | | پردێ، ئاڵتون کۆپری | ٣٣٥ |
| | | سەرگەڕان (قدس) | ٨٠٧ |
| | | | ١٦٨٩ |
| | | سەرجەم پارێزگاکە | ١٠٣٩١ |

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | رووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| موسڵ | موسڵ | مەڵبەندی قەزا | ٢٠٨ |
| (نەینەوا) | | باشیقە، بەعشیقە | ٥٢٦ |
| | | | ٧٣٤ |
| | قەرەقوش | مەڵبەندی قەزا | ١٧٥ |
| | | کەڵەك، ئاسکی کەڵەك | ٣٢٥ |
| | | نەمرود | ٤٧٣ |
| | | بەرتەلە | ٢١٥ |
| | | | ١١٨٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | تلکێف | مەڵبەندی قەزا | ٤٠١ |
| | | وانە | ٣٦٦ |
| | | ئالکیش (ئەلقوش) | ٥٠٨ |
| | | | ١٢٧٥ |
| | شنگار | مەڵبەندی قەزا | ٧٠٤ |
| | | شیمال، سنونی | ١٧١٦ |
| | | قەیرەوان | ٧٧٠ |
| | | | ٣١٩٠ |
| | تەلەعفەر | مەڵبەندی قەزا | ٨٢٤ |
| | | زوممار | ١٢٦٨ |
| | | ئاڤاگەنی (عیوازیە) | ٧٨٤ |
| | | رەبیعە | ١٤٣١ |
| | | | ٤٣٠٧ |
| | شێخان (عەین سوفنی) | مەڵبەندی قەزا | ٥٢٤ |
| | | مرێبە | ٤٤٤ |
| | | ئەتروش، مزوری | ٢٩١ |
| | | | ١٢٥٩ |
| | ئاکرێ (عەقرە) | مەڵبەندی قەزا | ١٤٣ |
| | | نەهلە، دینارتە | ٩٣١ |
| | | ناوکوڕ (عەشائیرولسەبعە) | ٨٥٠ |
| | | سورچی | ٣٢٥ |
| | | گردەشین | ٥٩٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | ٢٨٤٧ |
| | | سەرجەم ناوچە کوردستانییەکان | ١٤٨٠٠ |
| تکریت (سەلاحەدین) | دوزخورماتو | مەڵبەندی قەزا | ٥٧٣ |
| | | ئامرلی | ٧٣٩ |
| | | سلێمان بەگ | ٢٨٨ |
| | | نەوجول | |
| | | قادرکەرەم | ١٤٥٠ |
| | | | ٤٠١٩ |
| | | سەرەجەم ناوچە کوردستانییەکان | ٤٠١٩ |
| بەعقوبە (دیالە) | خانەقین | مەڵبەندی قەزا | ١٢٨٨ |
| | | مەیدان | ٥٧٩ |
| | | قۆرەتوو | ٩٢٧ |
| | | جەلەولا، قەرەخان | ٤٦٧ |
| | | قزلڕبات (سەعدیە) | ٦٥٤ |
| | | | ٣٩١٥ |
| | مەندەلی | مەڵبەندی قەزا | ١٥١٣ |
| | | قەزانیە | ٣٠٥٧ |
| | | بەلەدروز | ٢٠١٧ |
| | | | ٦٥٨٦ |
| | شارەبان | مەڵبەندی قەزا | ٥٤٢ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | ٥٤٢ |
| | كفری | مەڵبەندی قەزا | (٠٠٠) |
| | | جەبارە | ٩٢٤ |

| پارێزگا | قەزاکان | ناحیەکان | ڕووبەر(کچگ) |
|---|---|---|---|
| | | سەرقەڵا | ٥٧٤ |
| | | کۆکس | ٤٣٠ |
| | | قەرەتەپە | ٩١٣ |
| | | | ٢٨٤١ |
| | | سەرجەم ناوچە کوردستانییەکان | ١٣٨٨٤ |
| کوت (واست) | بەدرە | مەڵبەندی قەزا | ٨٧٠ |
| | | زرباتیە | ٩٦٥ |
| | | جەصان | ١٩٠٥ |
| | | | ٣٧٤٠ |
| | | سەرجەم ناوچە کوردستانییەکان | ٣٧٤٠ |

١-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء المجموعة الأحصائية السنوية لسنة ١٩٨٥

٢-لە نوسینەوەی ناوی پارێزگاو قەزاو ناحیەکانیاندا، لەپاڵ ڕەسمییەکاندا، ناوە نارەسمییەکانیشمان نووسیوەتەوە.

| زنجیره | کیشوەر | وڵات | ڕوپێو (کچگ) |
|---|---|---|---|
| | ئاسیا | کوردستانی باشور | دەوروبەری ٨٥٠٠٠ |
| ١ | | میرنشـینه یـەکگرتووەکانی | ٨٣,٦٠٠ |
| ٢ | | عەرەب | ٦٩,٧٠٠ |
| ٣ | | گورجستان | ٦٥,٦١٠ |
| ٤ | | سریلانکا | ٤٧٠٠ |
| ٥ | | بوتان | ٣٥,٩٦١ |
| ٦ | | تایوان | ٢٩,٨٠٠ |
| ٧ | | ئەرمەنستان | ٢١,٠٥٦ |
| ٨ | | ئیسرائیل (بەفەلەستینەوە) | ١٧,٨١٨ |
| ٩ | | کوەیت | ١١٠٠٠ |
| ١٠ | | قەتەر | ١٠,٤٠٠ |
| | | لوبنان | |
| | ئەوروپا | | |
| ١ | | نەمسا | ٨٣,٨٥٣ |
| ٢ | | چیك | ٧٨,٨٦٤ |
| ٣ | | سکوتلاند | ٧٨,٧٦٤ |
| ٤ | | کۆماری ئیرلاند | ٧٠,٢٨٤ |
| ٥ | | لیتوانیا | ٦٥,٢٠٠ |
| ٦ | | لاتڤیا | ٦٤,٥٠٠ |
| ٧ | | کرواتیا | ٥٦,٥٨٣ |
| ٨ | | بۆسنەهێرزۆگۆڤینا | ٥٢,١٢٩ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩ | | سلۆڤاکیا | ٤٩,٠٣٥ |
| ١٠ | | ئستۆنیا | ٤٥,١٠٠ |
| ١١ | | دانیمارك | ٤٣,٠٩٢ |
| ١٢ | | هۆڵەندە | ٤١,٨٤٤ |
| ١٣ | | سویسرە | ٤١,٢٩٣ |
| ١٤ | | مۆڵداڤیا | ٣٣,٧٠٠ |
| ١٥ | | بەلجیکا | ٣٠,٥١٨ |
| ١٦ | | ئەڵبانیا | ٢٨,٧٤٨ |
| ١٧ | | مەکەدۆنیا | ٢٥,٧١٣ |
| ١٨ | | سلۆڤینیا | ٢٠,٢٥١ |
| ١٩ | | ویڵز | ١٥,١٢٠ |
| ٢٠ | | ئیرلاندی باکور | ١٤,١٤٦ |
| ٢١ | | مۆنتی نیگرۆ | ١٣,٨١٢ |
| | ئەفریقیا | | |
| ١ | | سیرالیۆن | ٧١،٧٤٠ |
| ٢ | | تۆگۆ | ٥٦.٧٨٥ |
| ٣ | | گینیابیساو | ٣٦,١٢٥ |
| ٤ | | لیسۆتۆ | ٣٠,٣٥٥ |
| ٥ | | گینیای ئیستیوائی | ٢٨,٠٥١ |

| ٦ | | بۆرۆندی | ٢٧,٨٣٤ |
|---|---|---|---|
| ٧ | | رواندا | ٢٦,٣٣٨ |
| ٨ | | جیبۆتی | ٢٣,٢٠٠ |
| ٩ | | سوازیلاند | ١٧,٣٦٤ |
| ١٠ | | گامبیا | ١١,٢٩٥ |
| | ئـــــەمریکای | | |
| ١ | باکور | پەنەما | ٧٧,٠٨٢ |
| ٢ | | کۆستاریکا | ٥١,١٠٠ |
| ٣ | | دۆمینکان | ٤٨,٧٣٤ |
| ٤ | | هاییتی | ٢٧,٧٥٠ |
| ٥ | | هندۆراس | ٢٢,٩٦٥ |
| ٦ | | سلڤادۆر | ٢١,٠٤١ |
| ٧ | | دورگەکانی بەهاماس | ١٣,٩٣٥ |
| ٨ | | جامایکا | ١٠,٩٩١ |

1- Der Weltatlas 2000, Neef Und Stumme, Wittengen, Germany.

٢-لەدانانی ئەم پاشکۆیەدا ناوی ئەو وڵاتانە فەرامۆشکراوە کە روپێوەکەیان دەهەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەو بەرەو خوارترە.

# سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانینم بۆ ئەم بەڕێزانە کە هەریەکە بەجۆرێک و شێوەیەک هاوکاریان کردووم بۆ نووسینی ئەم کتێبە.

ئەندازیار/ سەروەر ئەنوەر، دیاری تاریق، بەهار مەحمود، حسێن محەمەد عەزیز، نەوزاد عەزیز، وریا عەبدوڵڵا، ئاوێزە غەریب، کۆزاد محەمەد، ئەردەڵان سەعید، محەمەد قەرەداغی (هاوڕێ سوارە)، بەرهەم عەلی، جەزا تالیب، کەریم گەرمیانی و نەهرۆ هەیبی.

**ئەو کتێبو بلاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ١٩٩٩ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون**

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سێدارەکانی بەهەشت | قوبادی جەلی زادە | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢ | کورژنی خوێن | غەفور ساڵح | رۆمان | چاپکردن |
| ٣ | مەرگی سوشاب | عەلی کەریم | شانۆیی | چاپکردن |
| ٤ | بەسەرهاتی کەڵەپیاوێك | وەرگێڕانی حسین عوسمان نێرگزەجاری | رۆمان | چاپکردن |
| ٥ | مێژووی هۆزی جاف | حەسەن فەهمی جاف | مێژوویی | چاپکردن |
| ٦ | ژوورەکەی دەلیا | ئاکۆ کەریم مەعروف | کورتە چیرۆك | چاپکردن |
| ٧ | سەرەتایەکی زمان ناسی | میدیا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٨ | بیبلۆگرافیای کورد وکوردستان | ئەکرەم قەرەداخی | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٩ | کورد | و . د. عیزەدین مستەفا رەسول | مێژوویی | چاپکردن |
| ١٠ | نامیلکەی چالاکیەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بۆ ساڵی ١٩٩٩ | ئامادەکردنی فەرید زامدار | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١١ | حەپسەخانی نەقیب | پەخشان جەلال حەفید | مێژوویی | چاپکردن |
| ١٢ | وتنەوەی بیرکاری پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی | عەلی ئەحمەد | زانستی پەروەردەیی | چاپکردن |
| ١٣ | ئینسکلۆپیدیای کیمیا | جەمال عەبدول | زانستی | چاپکردن |
| ١٤ | کورتەجوگرافیای کوردستان | کەریم زەند | جوگرافیا | چاپکردن |
| ١٥ | دەفرە فڕیوەکان چۆن لەکوێوە هاتوون | ساڵح محەمەد | زانستی | چاپکردن |
| ١٦ | مردووەکان بنێژن | و.یاسین بەرزنجی | شانۆگەری | چاپکردن |
| ١٧ | میرزا مارف | ئومێد ئاشنا | ژیان و بەرهەمەکانی | چاپکردن |
| ١٨ | هاواری دڵ | بوار نورەدین | مەزهەبی خالقی | چاپکردن |
| ١٩ | بابەتەکانی پەروەردەی نوێ | فواد قەرەداخی | پەروەردەیی | هاوکاری |
| ٢٠ | وێنەکەی خوشکت | رۆوف حسن | کورتە چیرۆك | چاپ کردن |
| ٢١ | کلوە بەفرەکانی خۆر | هوشیار بەرزنجی | هۆنراوە | یارمەتی |
| ٢٢ | گوناهەکانی بەفرو سێبەر | محەمەد کاکە رەش | هۆنراوە | چاپ کردن |
| ٢٣ | گوێڕایەڵی بۆ ئامۆژگاریەکانی دایەو بابە | و. حەسەن عبدالکریم خانەی منداڵان | چیرۆکی منداڵان | چاپ کردن |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | | |
| ٢٤ | گوێ درێژ و پاشا | و.لەتیف هەڵمەت<br>خانەی منداڵان<br>ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکی<br>منداڵان | چاپ کردن |
| ٢٥ | جوان وچۆلەکەکان | و.نوری سەعید قادر<br>خانەی منداڵان<br>ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکی‌منداڵان | چاپ کردن |
| ٢٦ | گێژاوی پۆڵەندە | و.بورهان قانع | مێژوویی | چاپکردن |
| ٢٧ | گۆڤاری دایەلۆگ | ژمارە(٤) ی گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٨ | گۆڤاری شانۆ | ژمارە(٩) ی گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٩ | گۆڤاری ئاران | گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣٠ | دیاریەک بۆ یادی سەدویەک ساڵەی رۆژنامەگەری کورد | ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣١ | کۆمەڵزانی‌و کورد | فۆاد گاهر صادق | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٣٢ | باخچە رەژوەکانی حەقیقەت | شازین هێرش | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٣ | ئاوییەر | صدیق بۆرەکەیی | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٤ | هەناسەیەک لە تەنهاییدا | بەناز کوێستانی | پەخشان | چاپکردن |
| ٣٥ | دیوانی رەمزي مەلا مارف | رەمزي مەلا مارف | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٦ | حەپسەخانی نەقیب لە ئاوێنەی مێژوودا | رۆوف عیمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٧ | چارە نووس | صابرگرد عازەبانی | رۆمان | چاپکردن |
| ٣٨ | مدن کوردیە قدیمە | مەلا جەمیل رۆژ بەیانی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٩ | خۆزگەکانی بەرد هەڵکەنێک | ئا جمال عارف امین<br>ب . رۆشنبیری وهونەر | چیرۆکی مناڵان | چاپکردن |

**ئەوکتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠٠ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون**

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | منداڵ و شیعر | محمد کەساس | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢ | رۆژنامەگەری | و . مجید صالح | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٣ | ئافرەت لەمۆسیقاو گۆرانی کوردیدا | سەردار خدر حسین | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٤ | نۆزدەمیروکورد | ئەحمەد باوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٥ | دەچڵ نێرگز | محمد رحیم رمچان | چیرۆکی منداڵان | چاپکردن |
| ٦ | مێژووی کتێبخانەکانی سلێمانی | مارف ناسراو | مێژوویی | چاپکردن |
| ٧ | شایەت | و ، ئاشتی عوسمان دانش | شانۆیی | چاپکردن |
| ٨ | هەفتەبزانی | و . شێرزاد حسن | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٩ | چەند گیروگرفت ودیمەنێکی دەروونی | و . جلال خلف ژاڵەیی | زانستی | چاپکردن |
| ١٠ | فەرهەنگی زەوی زانی وێنەدار | کمال جلال غریب | فەرهەنگی زانستی | چاپکردن |
| ١١ | لەبازنەی شانۆدا | عەلی کەریم | شانۆیی | چاپکردن |
| ١٢ | بووژاندنەوەی رۆشنبیری ونەتەوەییی کورد | و صدیق صالح | مێژوویی | چاپکردن |
| ١٣ | چەند بابەتێك دەربارەی کەلتووری نەتەوەی کورد | سەلام مەنمی | کەلتوری | چاپکردن |
| ١٤ | مەرگی وەنەوشە | یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکی رۆژنامەنووسی | هاوکاری |
| ١٥ | زوبدەی عەقیدە | مەولەوی | شیعر | چاپکردن |
| ١٦ | گۆڤاری شەهید | بنکەی شەهید رێباز | گۆڤار | هاوکاری |
| ١٧ | گۆڤاری پەلکە زێرینە | بنکەی ئەدەبی منالان | گۆڤاری منالان | هاوکاری |
| ١٨ | گۆڤاری دیلانێ | منالپارێزی بەریتانی | گۆڤاری منالان | هاوکاری |
| ١٩ | خونچە گوڵ | عوسمان هەورامی | شیعری مندالان | چاپکردن |
| ٢٠ | سەمای لاولاو | ئەژی گۆران | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢١ | گۆرستانی ئەپیکورۆس | هاشم سەراج | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢٢ | ماچی باران و خاك سروەو پەیامی کوردایەتی | ئەحمەد هیرانی | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢٣ | شۆرشی ئاگری داغ | کاوە بەیات | مێژوویی | چاپکردن |
| ٢٤ | ورچی میهرەبان | حسەین ی نەجاتی | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٢٥ | رێبەندان | تەها ئەحمەد رەسووڵ | رۆمان | چاپکردن |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٦ | قوتابیەکی تەمەڵ | سۆران حەمەد | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٢٧ | جولەکەکانی کوردستان | ئەحمەد باوەڕ | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٢٨ | عندما تتكلم الارقام | الشيخ عطا الطالباني | سیاسی | چاپکردن |
| ٢٩ | نەخۆشییە دەروونییەکان‌و دەروون لەشییەکان (سایکۆسۆماتی) یەکان | محەمەد کەریم شەیدا | زانستی | چاپکردن |
| ٣٠ | هۆنراوەو چیرۆکی فولکلۆریی کوردەواری | محەمەد حەمە صالح تۆفیق | فولکلۆری | چاپکردن |
| ٣١ | رؤي كردية بكلمات عربية | ستران عبدالله | سیاسی | چاپکردن |
| ٣٢ | ئەجلیکا | و.جەمال جامی | کورتە چیرۆک | چاپکردن |
| ٣٣ | قەفەزی زێڕین | و. یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٣٤ | میهرەجانی مەولەوی | وەزارەتی رۆشنبیری | بابەتەکانی میهرەجان | چاپکردن |
| ٣٥ | دەروێشەکان بەدوای راستی‌دا دەگەڕێن | و.مەحمود مەلا عزەت | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٦ | شتە سەیرەکان | و.نوری سەعید قادر | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٣٧ | گۆڤاری هەزار مێرد | وەزارەتی رۆشنبیری | شوێنەوار | چاپکردن |
| ٣٨ | پەیامبەرو کلاو | و. خەبات عمر | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٩ | گۆڤاری ئاران | | گۆڤار | هاوکاری |
| ٤٠ | رۆژنامەی بەدرخان | | رۆژنامە | هاوکاری |
| ٤١ | گریانی گوڵە غەریبەکانی دۆزەخ | جوان هیدایەت فارس | کورتە چیرۆک | چاپکردن |

## ئەوکتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠١ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گوڵ فرۆش | حەمزا عەلی ئەمین | چیرۆکی منالان | چاپ |

